(چۆن نامە بەکوردی بنووسین ؟ ٠)

حسن صلاح (سۆران)

شناسنامه کتاب :

اسم کتاب : باڵەکوڵارە
نویسنده : حسن صلاح (سۆران)
ناشر : نویسنده
تیراژ : ۲۰۰۰
تاریخ چاپ : ۱۳۷۱
چاپخانه : جهان نما
حروفچینی : آی ـ بی ـ ام محمد طهماسبی
قطع : رقعی
چاپ : اول
صحافی : جهان نما
لیتوگرافی : دریا

## بە ناوی خودای زانا

—.—.—.—.—.—

## سەرەتا

خوێنەرانی خۆشەویست ! . زۆرکەس نامە بۆمن دەنووسن کە کوردی چۆن بنووسین یا نامەی کوردی چۆن ئاراستە بکەین. زۆر کەسی واش هەیە کە دەیەوێ بە زمانی کوردی نامە بنووسێ، بەڵام ڕێوشوێنی نازانێ .

منیش بۆ ئەوەی کە یارمەتی ئەو چەشنە کەسانە بدەم، ئەم کتێبەم نووسی، کە ببێتە ڕێنوێنی بۆ ئەو کسانەی کە کوردی نووسین باش نازانن ، بەڵام دەیانەوێ بە زمانیکوردی نامە بنووسن . بۆیە ناوی کتێبەکەشم نا " باڵە کۆلارە"، واتە وەک باڵی کۆلارە کە پڕە لە پەڕ، ئەمیش پڕە لە پەڕی نامە، کۆلارەش دەزانین کە پەلەوەرێکی زلە وەک هەڵۆ.

زۆرجاریش دە بینین ، کە لە خاڵبەندی نامە یاکتێب داچەند ئاڵۆزیەک ، لە نێو نووسەراندا هەیە ، بەشی خاڵبەندیشم بۆ ئەوە نووسی، کەلەم ڕێبازەدا کەڵکی لێ وەرگیررێ، بۆ وێنە زۆر لە نووسەران لە دووای دانانی چوکڵە (،) دێنن پیتی ( و ) بە چەشن وبە گوێرەی وشەی گرێ ( عەتف) دادەنێن، کە ئەمە دروست نیە . چون دوای چوکڵە پێووست بە(و) وی گرێ نیە . بۆ وێنە ئە ڕستەیە دروستە :

– " من دەڵێم، بەڵام ئەو گوێ شل ناکا". بەڵام ئەگەر بنووسین " من دەڵێم، و بەڵام ئەو گوێ شل ناکا". دروست نیە . دەبێ ئەمەش عەرز بکەم، کە ئە کتێبەم لە سە ر دڵو خوازی

## باڵە کۆلارە

سەروەری زاناو خۆشەویستم کاک تاها فەیزی زادە نووسی، کە لە نامەیەکدا نووسیبووی کتێبێکی وا زۆر پێویستەو دەبێ تۆ ئەو کارە بکەی، منیش قسەکەی کاک تاها زۆر لە دڵم کەوت و ئەم کتێبەم نووسی، کە بە هیوام بە خشڵی سەرنجی خوێنەران بڕازێتەوەو کەموو کوڕیەکانی پڕکەنەوەو تەکمیلی کەن .

حسن صلاح ( سۆران )

تاران – ۱۳۷۱

تهران : صندوق پستی ۱۵۸۷۵/۱۱۳۷
حسن صلاح ( سۆران )

## بەشی ١ خاڵبەندی

خاڵبەندی واتــــــــەعەلامەتدانان لە نووسینی کوردی دا ،مەبەستێکی فرە گرنگە، ئەم کارە لە تەواوی زمانەکانی دیکەش دا ، دەکرێ . خاڵبەندی لەڕاستی دا هەر ئەو حاڵەتانەیە، کە لە خوێندنەوەی مەبەستێک دا لەبەر چاوی دەگرین ، بۆ وێنە کاتێک دەقێک یا هۆنراوەیەک دەخوێنینــەوە، لە هێندێک جێگەی دا مەکس دەکەین ، لە هێندێک جێگەدا بە حــالّــەتــی پرسیار دەیخوێنینەوە و زۆر حاڵەتی دیکە لە بەر چـــاو دەگرین ، دەنا خوێندنەوەکەی ئێمە بۆ بیسەر شتێکی بێ مانا یا تاریک ونا وازیح دەبێ . بۆ وێنە ئەگەر مەبــــەستێکـــی پرسیاری بە چەشنی خەبری بڵێین، خوێنەر لێی تێک دەچێ .

نووسین یش هەر وایە. بۆ وێنە دەبێ لەو جێگەیــەدا ، کە خوێنەر دەبێ مەکسێکی چکۆلە بکا ، دروشمی (،)یان"چوکڵە" دادەنێین و لە جێگەیەک دا کە خوێنەر دەبێ حاڵەتی پرسیــار بە خۆی بگرێ ، دروشمی (؟) یان " پرسیار" دادەنین ، لـــە ڕاستی دا ، کەسێک کە مەبەستێک دەخوێنێتەوە، دەبێ بۆ حاڵی-بوونی بیسەر، ئەو حاڵەتانەی سەرەوە لە بەر چاوبگرێوکەسێک کەمەبەستێک دەنووسێ ، دەبێ بۆ حاڵی بوونـــــی خــوێنەر ، خاڵبەندی بکا .

خاڵبەندیش وەک تەواوی زانستگەلی دیکـــــە ڕێ و شوێنی تایبەتی هەیە، کە لم بەشەدا ، باســی دەکەم:

١ – ڕستە ( جوملە ): بەمەدەڵێین کە لە نێوان دوو-دانە(.) نوختەدا قەار بگرێ ، بۆ نموونە ئەمانە ڕستەن : "پیاو نابێ بترسێ". "هەر ترسانیک مەرگێکە" ،لیرەدا ،ڕستەی

".هەر ترسانێک مەرگێکە."،کە لە نێوان دوو دانە نوختەدایە، هەروەک لە ناوەکەی دەردەکەوێ ڕستەیە کە. دیارە جاری واش هەیە کە ڕستە لە هەوەڵی کەرت ( پاڕاگڕاف )ەوە، دەستی پێ دەکا، کە لەو حاڵەتەدا، فەقەت ئاخرەکەی نوختەیەیان جاری وا هەیە، لەپاش (:) "دوونوختە" دەستی پێ دەکا، کە لەم حالەتەش دا، لە ئاخریەکەی دا، نوختە دادەنێن.
بۆ وێنە " : پیاو نابێ بترسێ." ڕستەیەکە. پەس بۆمان ڕوون بووەوە، کە :

ئ ـ لە ئاخری هەر ڕستەیەک دا دەبێ نوختەیەک دابنێین،
مەگەر لە هێندێک جێگە، کە دوو نوختەی دەوێ .

ب ـ هەوەڵی ڕستە دەبێ یەکێک لەمانەی خوارەوە بێ :

- هەوەڵی پاڕاگڕاف ( کەرت )
- دوو نوختە (:)
- نوختە (.)

٢ ـ لەتە ڕستە ( عیبارەت ): بریەتیە لە بەشێک یا بەشگەلێک لە ڕستە. لەنێوان لەتە ڕستەکان دا، دوورشمی(،) چوکڵە" یا (؛)" چوکڵە و نوختە" یان دێڕی (—) درێژو (ـ) " دێڕی کورت " دادەنێن :

ـ لە کاتێکدا لە نێوان لەتەڕستەدا چوکڵە دادەنێن، کە مەکسێکی چکۆلە پێوویست بێ، وەک ئەمە: " کێوی کەماجار بەرزە، بەڵام کێوی شاهۆ لەو بەرزترە" کە لێرەدا ،"کێوی کەماجار بەرزە" نیوە ڕستەیە ولە پاش وشەی " بەرزە"، لە جێگەی چوکڵە کەدا، مەکسێکی چکۆلە دەکەین، جا دوای ئەوە نیوە ڕەستە کەی دیکە واتە " بەڵام شاهۆ لەو بەرزترە" — دەخوێنینەوە.

ـ لە کاتێک دا لە نێوان لەتەرستەدا ، چوکڵە و نوختە دادەـ نێن ، کە مەکسێکی نەختێک درێژتر دەکەن ،وەک ئەمە: "نالی هونەریکی زۆر بەرزبوو، وەفاییش هۆنەریکی زۆر بەرز بوو. کەلێرەدا ، لەتەڕستەی" نالی هۆنەرێکی زۆر بەرز بوو"، بە هۆی چوکڵە و نوختە، لە لەتە ڕستەی دوایی واتە" وەفاییش هۆنەریکی زۆر بەرز بوو" جوێ کراوە تەوە ،کە دەبێ لە کاتی خوێندنەوەدا ، مەکسێکی برێک درێژتر بکەین ، کە لە مەکسی چوکڵە درێژتربێ ، بەڵام لەمەکسی نوختە کورت تر بێ .

ـ لەکاتێک دا لە نێوان لەتە ڕستەکان دا دێری درێژ دادەنێن، کە لەتە ڕستەی دوایی درێژەیەکی نەپساوەوەی لەتە ڕستەی پێشی بێ ، وەک : " مەم، زین خۆشی دەویست ـ زین عاشقی مەم بوو." کە دێڕیکی درێژ دوو لەتە ڕستەکەی لەیەک جوێ کردوەتەوە .

ـ لە کاتێک دا لە نێوان لەتە ڕستەکان دا دێری کورت دادەـ نێن ، کە ئاخری دێر ( خەت ) بێ و ڕ ستەکە تەواو نەبێ و وشەکە بکرێ بە دوو لەتەوە ، وەک : داستانی خەج و سیامەند- یان دەماودەم دەگێراوە . کە لێرەدا چون وشەی" سیامەندیان" لە دێرێک دا تەوا نەبووە، لەتکراوەو بە هۆی دێری کورت بە یەکەوە نووساوە .

٣ ـ ڕستەی پرسیار: بەمە دەڵێن کە پرسیارێک لە ڕستە کەدابێ. بۆ ڕستەی پرسیار دروشمی پرسیار ( ؟ ) دادەنێن و لە دوای ئەو نوختە یەیک ، بەم چەشنە (؟. )،وەک " هەویری مەیان شێلا مەلایک ؟".

٤ ـ ڕەستەی سەرسوڕمان : بەمە دەڵێن کە مرۆڤ بەسەر سوڕمان یان بە هاوارکردنەوە شتێک بڵێ، وەک : "بەخودا ئەم عیسانە شتێکی عەجایەبە! یان " دەک ماڵت بە قوڕ نەگیرێ بۆ خەتت ، دەڵێی قرژاڵە! ." کە لە ڕستەی هەووڵ دا سەر سوڕمانی

تێدایە و لە ڕستەی دووهەمدا هاوار وفریاد. هەر وەک دیمان بۆ ئەم چەشنە ڕستانە، دورشمی سەرسوڕمان (!) دادەنێین ولە دوای ئەو نوختەیەک (!.).

٥ ــ کەرت ( پارگراف ): ئەمەیە کە مەبەستگەلی جیاواز بە جوێ بنووسین . بۆ وێنە لە نامەیەکدا ، لە کەرتی هەوڵ دا ، هەواڵپرسی دەکەین ، لە کەرتی دووهەمدا خەبەری سڵامەتی خۆمان ڕادەگەێنین ، لە کەرتی سێهەمدا مەبەستی ئەسڵی دەنووسین ، لە کەرتی چوارەمدا ، نامەکە دا دەکوژێنین . بۆ دروست کردنی کەرت و چەشنی ئەوی یا ساگەلی جۆربەجۆر هەیە ، بەم لەونەی خوارەوە:

ئ ــ نزیکی دوو سانتیمتر سەری دێرەکە بەجێ دەهێڵن و دەستی پێ دەکەن :

چاویان بۆ عەقڵ داناوە. هەر چیەکمان بیست دەبێ تابەچاوی خۆمان نەبینین بروا نەکەین ، چون خەڵک زورشت دەڵێن ، کە هیچی وانیە ، جاری واش هەیە نابێتەنیا بە بیستن ودیتن باوەڕ بکەین ، بەڵکە دەبێ دەسیشی لێ دەین .

خەودیتن زۆر شتێکی عەجایەبە ، زۆرکەس کەمتر خەو دەبینن ، بەلام زۆر کەس هەمو شەوێک خەو دەبینن ، لە ڕاستی دا پێیت وانیە کە خودی ژیانی ئێمەش هەرخەوبینیە؟.

ب ــ فەقەت لەباری ئاسۆیی یەوە مەوادای بۆ دادەنێن ، وک :

دەیانگوت کە سالی هەشتاوهەشتەکە ، هێندە گرانی بوو ، کە خەڵک هیچیان نەبووە بیخۆن ، زۆر جارد چوون لە کێو بەردە ئاهەکیان دەخوارد.

ئەوەندە خەڵک شتی خراپیان خواردبوو کە نەخۆشی تاعوون هاتبوو. دەیانگوت خەڵک وەک گەڵای دار دەمردن و دەکەوتن بەسەر یەکەدا . کەس نەبوو، کە کەس لە قەبرـ نێ . خەڵکیان دەخستە چاڵە قووتی دەستەجەمعیەوە.

٦ ـ وەزر ( فەسڵ ) : هەروەک دەزانین لە چەندین کەرت و لاپەڕە ، فەسڵ یا وەرز پێک دێ . وەرز زیاتر لە نووسینی کتێبدا بە کار دەبرێ .

٧ ـ بەرگ ( جەڵد ) : لە چەند وەرز، بەرگ پێک دێ و کتێبی واش هەیە کە لە چەند جەڵد پێک هاتووە، وەک کتێبی ( مشاهیری کرد) نووسراوی بابا مەردوخی ڕۆحانی ( شیوا ) کە لە چەند بەرگ پێک هاتووە.

## چەمبەندی مەبەستی خاڵبەندی

١ ــ وتار لە پیت پێک هاتووە، وەک پیتی " ئ ".
٢ ــ بەش لە چەند پیت پێک هاتووە، وەک " سە ".
٣ ــ وشە لە چەند بەش پێک هاتووە، وەک " ئەسەد ".
٤ ــ لەتە ڕستە لە چەند وشە پێک هاتووە، وەک " ئەسەد شێرە ".
٥ ــ ڕستە لە یەک یا چەند لەتە ڕستە پێک هاتووە، وەک: " ئەسەد شێرە ، شێری جەنگەڵ " یا " ئەسەد شێرە ".
٦ ــ کەرت لە چەند ڕستە پێک هاتووە، کەمجاری واش هەیە کەرت تەنیا لە ڕستەیەک پێک دێ .
٧ ــ وەرز لە چەند کەرت پێک هاتووە.
٨ ــ بەرگ لە چەند وەرز پێک هاتووە.
٩ ــ زۆرکتێبی واش هەیە یەک بەرگە ــ هی واش هەیەچەند بەرگە .

دورشمی خاڵبەندیش بەکورتی ئەمانەن :

١ ــ نوختە (.) .
٢ ــ چوکڵە (،)
٣ ــ چوکڵە ونوختە (؛ ) .
٤ ــ دورشمی پرسیار (؟) .
٥ ــ دورشمی سەر سوڕمان (!)
٦ ــ دوونوختە (:) ،بۆ ئەوەیە کە نیشان بدەین لە خوارەوە دەمانەوێ شتێک بنووسین ، وەک : قەت ئەم کارانە مەکە :

ــ دزی ــ درۆ .

٧ ـ نەقلّی قەول ( ٬ ) : کە قەولی کەسێکی دیکە نەقلّ دەکەین ، وەک شاعیری مەزن سەیف دەفەرمویّ " بە کوتە شانامان گەلان دەمێنن بە میرومەزنان شان دەشەکێنن " .

٨ ـ پارانتێز ( ) : کە شتێکی تێدا دەنووسرێ ، تەوزیحی بەشی پێش پارانتێزە کەیە : وەک : هەرێم وانە (دەرس) دەخوێنێ .

٩ ـ مومەیز / : بۆ ئەوە بەکار دەبرێ کە هی پاش مومەییز یا پێش مومەییز خەت بکێشی یا هیچیان خەت نەکێشی، وەک :

ـ خوشکە ڕووناک :

ـ خوشکە ڕووناک / کاک سەردار

## ئەلفوبێی کوردی

پیتەکانی ئەلفوبێی کوردی بە پێی ڕێنووسی تازە ئەمانەن :

ئ : کە بریەتیە لە ( ا ) . بو نووسینی (آ )ی فارسی لە کوردی دا (ئا ) بەکار دەبەن
ب : کە بریەتیە لە ( ب ) فارسی
پ : کە بریەتیە لە ( پ ) فارسی
ت : کە بریەتیە لە ( ت ) فارسی
ج : کە بریەتیە لە ( ج ) فارسی
چ : کە بریەتیە لە ( چ ) فارسی
ح : کە بریەتیە لە ( ح ) فارسی
خ : کە بریەتیە لە ( خ ) فارسی
د : کە بریەتیە لە ( د ) فارسی
ر : کە بریەتیە لە ( ر ) فارسی
ڕ : کە بریەتیە لە ( ڕ ) قەڵەو ، وەک "درۆ"، کەبە مانای " دڕک " یا " خار"ە
ز : کە بریەتیە لە ( ز ) فارسی و ذ ، ض و ظ
ژ : کە بریەتیە لە ( ژ ) ی فارسی
س : کە بریەتیە لە (س ) ی فارسی و ث وص
ش : کە بریەتیە لە ( ش )ی فارسی
ع : کە بریەتیە لە ( ع )ی فارسی
غ : کە بریەتیە لە ( غ )ی فارسی
ف : کە بریەتیە لە ( ف )ی فارسی
ڤ : کە بریەتیە لە ( v ) فەڕانسە ، وەک حەڤدە
ق : کە بریەتیە لە ( ق )ی فارسی

ک : کە بریەتیە لە ( ک ) فارسی
گ : کە بریەتیە لە ( گ ) فارسی
ل : کە بریەتیە لە ( ل ) فارسی
ڵ : کە بریەتیە لە ( ڵ ) قەڵەو، وەک "گوڵ".
م : کە بریەتیە لە ( م ) فارسی
ن : کە بریەتیە لە ( ن ) فارسی
و : کە بریەتیە لە ( و ) فارسی
ۆ : کە بریەتیە لە ( و ) وی قەڵەو، وەک " چۆم" ،واتە چەم یا ڕووبار.
هـ : کە بریەتیە لە ( هـ ) ی فارسی
ە : کە بریتەتیە لە(ـە ) ی فارسی، وەک "سەر"و"خەفەت"

دیارە پیتی (ە)قەت لە هەوەڵی وەشەوە نایە .

ی : کەبریەتیە لە (ی) ی فارسی .
ێ : کە بریەتیە لە (ێ) ی قەڵەو ، وەک " شێر" کەواتە شێری جەنگەڵ .

## بەشی ٣ ئـولگوی نامەکان

خۆشەویستان! لێرەدا دێینە سەر نیشان دانی نموونەی نامەکان بە زمانی کوردی: دیارە هەروەک دەزانین، دەتوانین نامە بە شێوەی جۆر بە جۆر بنووسین. بەڵام من لێرەدا، ساکارترین ئولگوی نامەکانتان پێشکەش دەکەم.

### ١ ـ نامەی مامۆستا بۆ قوتابی:

بەناوی خودای زانا ١٣٧١/٨/١١

بۆکوڕی خۆشەویستم کاک زانیار.

لە دوای سڵاو، لە دوورەوە ئەو کوڕەخۆشەویستم ماچ دەکەم، بە هیوام ساغ بی و وچانی (تەعتیلاتی) ئەمساڵ بە خۆشی ڕابوێری.

لەمن بپرسی سڵامەتم وهیچ پەژارەیەکم نیە. زۆرتر خەریکی چاک کردنی تێزی خوێندکارەکانم و تا ئێستا، دوو دانە سێمینارو سەمپوزیومیکمان بوو، کە سەبارەت بەزمانی کوردی بوو و لە هەر دووکیاندا بەشداریم کرد.

مەبەست لە نووسینی ئەم نامەیە، ئەوە بوو کەپێت ڕاگەیێنم ئەمساڵ چەند ڕۆژ زووتر، واتە لە ١٥ی مانگی خەرمانان‌دا کلاسەکانمان دەکرێنەوە، کەبە هیوام لە ڕۆژی دیاری کراودا، بێی بۆ زانستگە، هەتا بە دوا نەکەوی.

سەرکەوتنتان لە خودا دەخوازم. زانا حاجی عەلی
( دەرس وێژی زمانی کوردی )
لە زانستگەی مەولەوی

## - ٢ - وەڵامی قوتابی بۆ مامۆستا

بەناوی خودا 1371/8/18

مامۆستای خۆشەویستم ئوستاد زانا حاجی عەلی

لەگەڵ سڵاو و دەست ماچ کردنی ئەو مامۆستا خۆشە ویستە ، کە تەواوی تەمەنی پڕ بایەخی خۆی بۆ پەرە پێدانی زانست تەرخان کردووە، هیوادارم کە لەش ساغ بی و قەت هیچ پەژارەیەکت نەبێ .

مامۆستاگیان ! نامەی ڕێکەوتی 1371/8/11 م زیارت کردو نامە سەر چاوم. لەوەی کە مەرحەمەتتان فەرموو بووو منتان لە دەست پێ کردنی کلاسەکان ئاگادار کردبوو، زۆر-سپاستان دەکەم ـ هەر سە بەرز و بەختەوەر بی .

بەپێی ڕێنوێنی ئەو خۆشەویستەم، لە ڕۆژی ١٥ی ـ مانگی خەرماندانداندا ، دێم بۆ سەر کلاس و جگە لەمەش هەواڵ بە کاک دیاکو وکاکە مەم و خوشکەزێوین یش دەدەم کە لەو ڕۆژەدا ئەوانیش بێن .

هەروەک دەزانی،من تەعتیلاتی ئەم ساڵ لەدێی کانی ساردم ،کە بەراستی وەک بەهەشت وایە ، نازانی چ ئاوێکی خۆش وساردی هەیە ، لە لایەکی دیکەشەو بەیانی بە دەنگی قاسپەی کەوی دوندی کێوی ئەکەرۆز بەخەبەردێم ـ کە جوان-ترین سەمفۆنیە ، بەڕاستی جێگەت خاڵیە، دەبێ ساڵی داهاتوو تۆش تەشریف بهێنی .

قوتابی چکۆلەی ئێوە ـ زانیار ڕوستەم

## ٣ - نامەی قوتابی بۆ ماموستا

بەناوی خوادای زانا ١٣٧١/٨/٣

ماموستای خۆشەویستم ئوستاد ڕێزان سەعید - زانستگەی کوردستان.

لە دوای سڵاو و هەواڵپرسی، لە دوورەوە دەستتان ماچ دەکەم. بە هیوام کە شیاوی ئەوەبم قوتابی ئێوە بم ولە داهاتوودا بتوانم وەک ئێوە خزمەتگوزاری خەڵک بم.

لە ڕووی لوتفەوە لەم شاگردەی خۆتان بپرسن، بە مەرحمەتی ئێوە چاکم و ئێستا لە دێی کارێزە، لە ماڵی بابم تەعتیلاتی هاوین رادەبوێرم، بە ڕاستی هێندە هەوا-یەکی خۆشی هەیە، کە جێگەی ئێوە بەتاڵە. کورد گوتەنی " مردو زیندو دەکاتەوە".

ماموستای پایە بەرز! هەر وەک دەزانن ئەمساڵ دەورەی باکالۆریا ( لیسانس )ی زمانی کوردی تەواو دەکەم و ساڵێکی دیکە دەچمە دەورەی ام . اس ( فەوقی لیانس )، هەر لەبەر ئەمە، دەمەوێ تکاتان لێ بکەم کە ئەگەر دەکرێ ئەمساڵیش هەر لە کلاسەکەی خۆتاندابم و لە بەردەستیخۆتاندا کاربکەم - بەشکو بتوانم ببمە شاگردی ڕاستەقینەی ئێوە لە ژیان دا. جا ئەگەر ئەم تکایەم قەبوول دەفەرمووی، بە نامە خەبەرم دەرێ، دەتا دەچمە زانستگەی گۆران لەوێ-دەرس دەخوێنم .

بەهیوای لەش ساغی و کامەڕانی ئیوەیبەڕێز.

قوتابی چکۆلەی ئێوە

ئالان موکوریانی

## ٤ ـ وەڵامی ماموستا بۆ قوتابی

بەناوی خودای زانا ١٣٧١/٨/١٥

قوتابی خۆشەویستم کاک ئالان موکوریانی

پاش ڕێز و سڵاو، نامەی ڕێکەوتی ١٣٧١/٨/٣ی ئەو خۆشەویستە گەیشتە دەستم . لە مەرحەمەتی تۆ زۆر سپاسگوزارم .

هەواڵی منتان پرسیبوو، کە بە لوتفی خودا ساغ و سڵامەتم ومنیش لە تەعتیلاتی هاوینی بووم ـ چووبوومە دێی زێدی خۆم ـ واتە ئاوایی مازوچنە وتازە چەند ڕۆژە هاتومەتەوە ، نازانم دەزانی کە دێی مازوچنە چ تایبەتمەندیەکی هەیە یا خەیر؟. هێندەی دار مازو هەیە کە لە نێودا ردا ، دێ قوم بووە . بۆخوشت دەزانی کە مازو چ دارێکی بەپیتە ، ـ حەوت بەری هەیە .

سەبارەت بە داوخوازیەکەتان ، بەسەر چاو، ئەمساڵیش هەر کارێکی وا دەکەم، کە بێیتە کلاسەکەی خۆم ، چون دەزانم کەقوتابی وەکو تۆ دەبێتە جێگەی شانازی بۆمن و ولاتەکەم. هەر سەرکەوتوو بی .

بەڵام ئەگەر دەکرێ پێنج ڕۆژ بەر لە کرانەوی کلاسەکان ، چاوت بە من بکەوێ تابڵێم چی بکەی .

بەخودای گەورت دەسپێرم.

ڕێزان سەعید

ماموستای زمانی کوردی زانستگەیکوردی

## ٥ ـ نامەی دایک بۆ کوڕ

١٣٧١/٨/٥

کوڕی خۆشەویستم ، نووری چاوانم چالاک گیان

چاوە جوانەکانت ماچ دەکەم و لە خودا دەخوازم کە قەت بەردی سارد و گەرم نەهێتە سەر ڕێگەت وگشت کات ساغ وبەختەوەر بی .

خۆشەویستی خوشەویستانم : ئێمە گشتمان ساغ وسڵامەتین . بابت شوکور وەزعی زۆر چاکە ، هێرۆش دەرسەکانی زۆر چاک دەخوێنێ . لاوێن و لاس یش هەر وەک جاران لە ئیدارە کار دەکەن و ماڵ ومنداڵی هەردووکیان سڵامەتن و هەموولایک دوعات دەکەیینن . تەواوی دەروجیران و خزم و کەس وکاریش سڵاوت بۆ دەنێرن .

ئێمە ڕۆژ بە قامک دەبژێرین ، کە زووتر سەربازیەکەت تەواو بێ و بگەڕێیتەوە بۆ ماڵێ، کاریشمان بۆ پەیدا کردووی ، بڕیار وایە کە لە بانک دا مەزرێی.

لەگەڵ ئەم نامەیە دا ، دوو جووت گورەوی بەن ، کراسێکی زستانی و سێ دانە دەسرە دەستم بۆ ناردی، کە بە هیوام بە کەلکت بێن .

ئیدی بە خودای گەورەت دەسپێرم.

دایکت ـ کاڵێ

## ٦ ـ وەڵامی نامەی کوڕ بۆ دایک

ـ.ـ.ـ.ـ.ـ.ـ.ـ.ـ.ـ.ـ

بەناوی خودای تاق و بەتەنی

١٣٧١/٨/١٨

دایکی بەڕێزم ، هیوای ژیانم .

دەستەکانت ماچ دەکەم ، ئەو دەستانەی کە لە کاتی بێ هێزی و ساوایی مندا ، بن باڵیان گرتم . لە خودا دەخوازم کە ئەو تواناییە بەمن بدا ، کە کاتێ ئێوەش پیر بوون ولاواز بوون ، منیش بن باڵی ئێوە بگرم.

نامەی ١٣٧١/٨/٥یش گەیشتە دەستم وماچم کرد ونامە سەر گلێنکەی چاوم. لە مەرحەمەتی تۆو تەواوی بنە ماڵە و دەروجیران و خزم و کەس و کار سپاسگوزارم . منیش بە سایی خوداوە سلامەتم و زیاتر لە مانگێ بۆ ئاخری دەورەی سەربازیم نەماوە، کە ئیشەڵڵا هەرچی زووتر تەواو بێ و بێمەوە بۆ نێوتان . دۆعای هەموو لایەکیش دەگەیینم.

ئەو شتانەش کە ناردبووت گەیشتنە دەستم ، زۆر ـ سپاس ، بەڕاستی لەم مەڵبەندە ساردەدا ، زۆر بەکارم دێن . ئەمەش کە لە بانک کارتان بۆ پەیدا کردوم خوشحاڵم ،بەڵام نەتان نووسیبوو کامە بانک ؟

بەهیوای ئەوەی کە هەرچی زووتر بە خزمەتتان بگەم.

کوڕی ئێوە ـ چالاک

## ٧ ـ نامەی کوڕ بۆ دایک

بەناوی خودای گەورە

١٣٧١/٨/١

نووری چاوانم دایکی بەڕێزم ـ بۆکان

هەر لە ئێرەوە هەتا شارە جوانەکەی بۆکان، کەزێدی سەرداری سەرداران بووە، سڵاوتان لێ دەکەم. بە هیوام کە هەمووتان ساغ وسڵامەت بن.

منیش سڵامەتم و هەر وەک جاران لە کارخانەی داڕوسازی ئیش دەکەم. زۆر لە کارەکەم خۆشم دێ، چون دەزانم ئەو دەرمانانەی کە ئێمە لەم کارخانەیەدا دروستیان دەکەین، بۆ شکاندنی ژانی لەشی خەڵک وبۆ چاک کردنەوەی دەردە داران بە کار دەبرێن. مووچە کەشم هێندێک زیادی کردوە، بەڵام هێندە کرێ خانوو گرانە، ئەوە کارەکەی تێک داوە.

خێزانم و ڕووناک وهێرش ساغن ودەستی هەموو لایەکتان ماچ دەکەن. خۆشم دوعای تەواوی خزم وناسیاو دەگەیێنم و لە خزمەت تەواوی بنەماڵەی خۆماندا سڵاوم هەیە.

ئەگەر بۆم کرا بۆ تەعتیلاتی هاوین، بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ ـ دێمەوەو منداڵەکانیش لەگەڵ خۆمدا دەهێنم. ئەگەر شتێکی تایبەتتان پێویستە، بۆم بنووسن تا لەگەڵ خۆمدا بۆتانی بهێنم.

کوڕی ئێوە ـ سامڕەند

## ٨ - وەڵامی دایک بۆ کوڕ

بەناوی خـــودا

١٣٧١/٨/٢٠

عازیزی خۆشەویستم سامرەند - تاران .

نامەی ریکەوتی ١٣٧١/٨/١ی ئەو خۆشەویستە گەیشتە دەستم و ماچم کرد و زۆر بە دیققەت خوێندمەوە. منیش لە گەڵ باوکت و تەواوی بنەماڵەی خۆمان دۆعای خۆت وخێزانت ومناڵەکانت دەگەیێنین . بە هیوایـن کە هەموو کاتێک ساغ وسڵامەت بن. لەوەی کە مووچەکەتان زۆرتر بووە، زۆرخۆشحالین، بەڵام دیسان هەر بیرو رامان ئەوەیە کە خۆزگە هەر لێرەبیشت دەکرد. ئیستا هەرچی لە تاران دەردەهێنی، دەبێ بیدەی بە کرێ خانوو. بەڵام لێرە بۆ خۆمان ئەم کەلەوایەمان بوو ، تێی دا دادەنیشتین وتیکەیەک نانیش هەر پەیدا دەبوولەگەڵ مناڵەکان دا ، بیخوی .

گوتبووت کە بۆ تەعتیلاتی هاوین دێنەوە، کەزۆر خۆشحال بووین . ئەگەر دەکرێ هەر کات ھاتنەوە، بـــرێک زەعفەران و نەختیک لیمۆ عەننابی لەگەڵ خۆدتان بهێنن . دیسانەوە داوای ساغی وسڵامەتی تان بە دەکەم.

دایکی تۆ - بەستێ

## ٩ـ نامەی هاوالّی پیاو بۆ هاوالّی پیاو

بە ناوی خودای مەزن ١٣٧١/٨/٤

هەوالّی خۆشەویستم کاک هەلّۆ ئەحمەدی ـ سنە

لەگەلّ سلاّوی تایبەتدا ، بەهیوام کە ساغ وسلاّمەتـ ـبی و لە کانی دلّمەوە ، دۆعاتان دەگەیێنم .

لە من بپرسی زۆر چاکم وهیچ پەژارەیەکم نیە. کاکی خوم ! نازانی چەندێک دلّم بۆت تەنگ بووە. ئەلعان نزیکەی دووسالّە نەمدیوی ، چی بکەم ئەسلّەن مەرەخەسی بەمن نادن ـ چون کارەکەم زۆر گرنگە و لە لایەکی دیکەشەوە ، بۆ بەدشانسی، کەس نیە لەم یانەی ئێمە ئەم کارەی من بزانێ تا ئەگەر لێرە نەبووم، ئەو کارەکەی من ئەنجام بدا .

جانازانم تۆ چۆنی؟. بە خودا ئەگەر بۆت بکرێ تۆبێی بۆئێرە باشترە. براگیان ! دەستی ژن ومندالّەکەت بگرەووەرە چەند ڕۆژ لە لای ئێمەبە. دنیا دەبرێتەوە ، بەلاّم ئەوەی کە بایەخی زۆرە ئەوەیە کە عیسان لەگەلّ دۆست وهاوالّی خۆی ـ براکەم ! هەر وەک دەزانی ، ئێستا دۆستی چاک زۆر کەمە، جا ئەگەر یەکێک پەیدا بوو نیعمەتەو دەبێ کەلک لەو نیعمەتە وەرگری .

زۆر دۆعای براژن ومندالّەکان بگەیێنە و بە هیوای ئەوەم کە نامەیەکم بۆ بنووسی وپێم بلّێی کە کەی تەشریف دەهێنی بۆ ئێرە.

بەهیوای بەختەوەری خۆت و بنەمالّەت .

سیامەند کورتەکی

## ١٠ - وەڵامی هاوڵی پیاو بۆ هاوڵی پیاو

بەناوی خودای گەورە ١٣٧١/٨/١٩

هاوڵی هێژاو بەرێزم کاک سیامەند کورتەکی،ئیسفەهان

هاورێی سڵاوی گەرم وگوڕ، نامەی ١٣٧١/٨/٤ی ئەو هاوڵە خۆشەویستەم پێ گەیی ونامە سەر چاوم. لە هەواڵی سڵامەتی ئێوە، زۆر خۆشحاڵ بووم. خۆم و خێزانم و گەزیزەی کچم وخانی کوڕم دۆعاتان دەگەیێنین .

کاک سیامەند گیان : لەوەی کە من وخێزانم ومنداڵەکانت دەعوەت کردوە، کە چەند ڕۆژ بێین لای ئێوە ڕابو - بڕین ، زۆر سپاست دەکەین . بە سەر ئەو چاوانەم، لە هەوەڵ مانگی هاوین (پووشپەڕ) دا ، کە حەوتەیەک تەعتیلین ،دێین بۆ لاتان . بەڵام قەرار وایە،بە ماشینەکەی خۆمان بێین ، تا لەوێ بتوانین تەواوی شوێنەوارە مێژوویەکان ببینین ، چون خۆت دەزانی کە بەبێ ماشین زۆر موشکوڵە. جا نازانم شەوانە بۆ ماشینەکە جێگەی پارکتان هەیە یا خەیر؟.

ئەگەر شتێکی تایبەتی تان دەوێ، کە لە شاری سنەوە بۆتانی بهێنم ، بە تێلیفۆن پێم بڵێ، دەبێ ئەمەشت عەرز بکەم دەستگایەکی کایەی شاترنجم سەندوە، کە لەگەڵ خۆم بەدیاری بۆت دەهێنم.

ئیدی هەر بژین بە بەختیاری

هەلۆ ئەحمەدی

## ١١ ـ نامەی هاوڵی کچ بۆ هاوڵی کچ

بەناوی خودای توانا ١٣٧١/٨/٢

دەستە خوشکی بەڕێز وخۆشەویستم چنور بۆکانی

خوشکیخۆم! سڵاو، لە خودای تەعالا دەخوازم کە ساغو سڵامەت بی، لەمنیش بپرسی هیچ پەرارەم نیە، مەگەر دووری تۆ.

بەهیوام کە لە دەرسەکاندا سەرکەوتووبی و بتوانی ئەمساڵیش وەک ساڵانی پێشوو بەنومرەی زور چاکەوە دەرچی.
دەرسەکانی منیش خراپ نین، بەڵام ڕێگەی زانستگە هێندەدوورە، کەعیسان هیلاک وماندو دەکا. چون هەر وەک دەزانی تەواوی شەوگەل دەبێ بە ئۆتۆبووس بڕۆمەوە بۆ ماڵێ و بەیانی بێمەوە بۆ زانستگە،کە هەموو جارێک دووسەعات بە ڕێگەوەم.

خوشکەچنور! نازانم بۆ کارە ئەسڵیەکە چیت کرد؟
قەرا وابوو، کە لەگەڵ کوڕی مامت ژیانی هاوسەری دەس پێ بکەی؟ دەزانم هێندێک شەرم دەکەی کە لەم بارەوە قسە بکەی، بەڵام دادە چنور، هەموو کچێک دەبێ شوو بکاوهەموو کوڕێک دەبێ ژن بهێنێ ـ ئیدی شەرمی پێ ناوی چاوەکەم، جا ئەگەر ـ وایە بۆم بنووسە بزانین کەی شیرینیە کە دەخۆین و کەی پڵاوەکەمان پێ دەدەی؟.

دادەچنوور! بەختەوەری تۆ ئاواتی منە و چاوەڕوانی نامەتم،کە ئەو هەواڵە خۆشانەی سەرەوەی تێ دابێ.

خوشکتان ـ هەلامە کۆکەیی

## ١٢ - وەڵامی نامەی هاواڵی کچ بۆهاواڵی کچ

بەناوی خودای بێ هاوتا

١٣٧١/٨/١٨

خوشکی هەرەخۆشەویستم دادە هەلامە کۆکەیی

نامەی ڕێکەوتی ١٣٧١/٨/٢ ئەو خۆشەویستەم زیارت کردو نامە سەر چاوم . پێم وابوو کە وێنەم بۆ دەنێری،بەڵام وێنەیەک لە نامەکەدا نەبوو- باشە من وێنەی تۆم لە دلم دا کێشاوە، قەی ناکا با نەتناردبێ . خوشکی خۆم! منیش پڕ بە دڵ سلاوتان لێ دەکەم و لە هەستی ناسکی ئێوە سپاس دەکەم.

هەلامەگیان ! لەمەی کە دەرسەکانت باشن زۆرخۆشحالم - دیارە دەبی هەر باش بێ - کچ دەچێتەوە سەر دایک وبابی. منیش خراپ نیم ، بە قەولی مەشهوور شایەد ڕەت نەبمەوە ! دادە هەلامە ! باسی شوکردنی منت کردبوو، کە دەبێ مزگێنی بە ئێوە بدەم کە قەرار وایە چەند ڕۆژی دیکە مامەم وئامۆژن بێن بۆ خوازبێنی وباوکم و دایکیشم کارەکەیان خستوەتە دەستمن . واتە : ئەگەر خودا کۆمەک بێ ، پێم وایە کار تەواوە. هەر وەک دەزانی هەڵمەتی ئامۆزام زۆر کوڕێکی باسەواد و بە ئیمانە. لەگەڵ ئەو گشتە دەرسەی کە لە وولاتە ڕۆژاواییەکان دا خوێندویەتی، سەری بچێ نوێژی ناچێ، یانی لە وانەیە کە دوای دەرس خوێندن بەئیمان تر بووە، منیش چون مەسلەی ئیمان و دین وبڕوای ئاینی زۆر گرنگە بۆم و لە لایەکی دیکەشەوە باسەوادە و ئامۆژامە، زۆر پێی ڕازیم. دیارە کاتی شایی کردن دەعوتیشت دەکەم.

ببورە کە پاکی باسی شووکردنی خۆم بوو. بە هیوام کە ئێوەش بە زوویی خودا بەختێکی باشتان بداتێ و هەواڵەکەی بە من بگا.

خوشکی تۆ ـ چنور بۆکانی

## ١٣ - نامەی ژن بۆ مێرد

بەناوی خودای میری مەزن

١٣٧١/٨/٤

مێردی دڵسۆز و خۆشەویستم

لەگەڵ سڵاوێکی گەرم، بە هیوام کە سڵامەت بی. من و ئەوین و پەشێو هەمووما ن ساغین و هەمیشە لە بیری تۆ داین.

مێردی عازیزم! ئەوە دوو ساڵە کە ئەو کارەت لە شاری کرمانشان گرتووە و زۆر تر مەجبووری کە لەوێ بی. ئێمەش کە بە خاتری دەرسی مناڵەکان و بە دەلیلی ئەوەی کە ماڵەکە چۆڵ نەبێ و نەڕوخێ، مەجبوورین هەر لە شاری مەهاباد بین، کە خۆت دەزانی ئەم دووریە زۆر موشکوڵە. ژن و مێرد ئەگەر لەکن یەک نەبن، هەزار دانە گیروگرفت دێتە پێشەوە. شەوانە لەگەڵ ئەو دوو منداڵە، لەم ماڵەدا بە تەنیا دەخەوین، هەزار دانە دز و درۆزن هەیە. بێجگە لەمە، هەزار نەخۆشی و سەریەشە وپایەشە هەیە. لەبەر ئەوانەی کە گوتم، ئەگەر کارێکی وا بکەی یا خۆت بێیتەوە بۆ مەهاباد یا ئێمە بەری بۆ شاری کرمانشان زۆر چاکترە.

دەرسی منداڵەکانیش خراپ نیە، بەڵام هەمیشە هەر بۆ تۆ بێ تاقەتی دەکەن. ماڵەکەشم تازە تەعمیر کردوە. چون سەربانەکەی زۆری دڵۆپە کرد بوو و دیوارەکانی خەریک بوو بڕوخێن. ئەو پووڵەی کە بە بانک دا ناردبووت، زۆرتریم بۆ تەعمیری ماڵە کە خەرج کرد. تازە چوار هەزار تمەنیشم لە حاجی زۆراب قەرز کردوە.

ئیدی لەوە زیاتر سەرت نایەشێنیم هاوسەری تۆ چمەن سەردەشتی

## ١٤ ـ وەڵامی نامەی مێرد بۆ ژن

١٣٧١/٨/١٦

ژنی خۆشەویستم چیمەن خانم ـ مەهاباد

لەگەڵ سڵاو، نامەی ١٣٧١/٨/٤ ئەو هاو ژینە خۆشەویستە گەیشتە دەستم و لە ناخی دڵەوە ماچم کرد. منیش دۆعای تۆ دەگەیێنم.

لە قەولی منەوە دۆعای تەواوی خزمەکان بگەیێنەو ئەوین و پەشێو ماچ کەو لە باتی من لە بەغەڵیان بگرە.

لەمەی کە بەلای کەمەوە دەرسی منداڵەکان باشە خۆشحاڵم. ئاهوناڵەیەکی زۆرتان کردبوو، کە بۆچی دەبێ لە یەکتری دوور بین. منیش حەق بە تۆ دەدەم، بەڵام چی بکەم بە قەولی کوردی " ڕوی ناعیلاجی ڕەش بێ". دەنا من قەت نامەوێ سەعاتێک لە تۆ و لە منداڵەکان دوور کەومەوە. ئەلعانیش لە هەوڵ دام، کە زووتر خۆم بخەمە مەهاباد یا دەوروبەری. بەڵام بۆخوت دەزانی هاتنی ئێوە بۆ کرمانشان بە یەکجاری ناگونجێ، چون خانووەکەمان لە مەهاباد لەنێو دەچێ.

نووسیبووت کە پووڵت لە حاجی زۆراب قەرز کردووە. بە بانک دا، دەهەزار تمەنم بۆ ناردی، کە هەم قەرزەکەی حاجی بدەیتەوە و هەم بێ مەخاریجیش نەبن.

قەرارروایە تا ٤٠ ڕۆژی دی بە مەرەخەسی بێمەوە، کە ئەوکاتە بۆ ماوەی دوو حەوتە لە ماڵێ دەمێنمەوەو زۆرتر لەم بابەتەوە قسە دەکەین.

مێردی تۆ ـ سەرکەوت مەهابادی

## ١٥ - نامەی جیران بۆ جیران

بەناوی یەزدانی مەزن ١٣٧١/٨/٣

کاک هەڵکەوت بانەیی، جیرانی بەڕێزم

سڵاو . هەر وەک دەزانی ئێستا نزیکەی دوو ساڵە بۆ کارێکی زۆر گرنگ هاتوومەتە سەفەر و لە شاری نەغەدەم و پێم وایە نزیکەی شەش مانگی دیکەشم پێ دەچێ .

کاک هەڵکەوت ! هەر وەک ئاگاداری،من سەڵتم ژن و منداڵم نیە و ڕۆژی هەوەڵیش بە ئومێدی خودا و بە ئومێدی تۆ ماڵەکەم بەجێ هێشت . ئەلعانیش هەر دڵم بەوە خۆشە کە جیرانێکی وەک تۆم هەیە و دڵنیام کە کەس ناوێرێ دزی و فزیم لێ بکا . دیارە براژن ومنداڵەکانیش چون زیاتر لە ماڵەوەن ، زۆرتر دەتوانن چاودێری لەو کەلەوایەی من بکەن .

بە ئومێدی خودا نزیکەی شەش مانگی دیکە دەگەڕێمەوە و بە سەر خۆمیەوە ناهێڵم ، ئەو زەحمەتەی ئێوە قەرەبوو دەکەمەوە .

لە قەولی منەوە دۆعای تەواوی ماڵ ومنداڵ و دەر و جیران بگەیێنە . لەگەڵ سپاسی دووبارە ، بەخوداتان دەسپێرم .

کەماڵ بێورانی

## ١٦ - وەڵامی نامەی جیران بۆجیران

بە ناوی یەزدانی دلۆڤان

١٣٧١/٨/٢٣

جیرانی زۆر بەڕێزم کاک کەماڵ بێورانی

لەپاش سڵاوی تایبەت، پێ تان ڕادەگەێینم کە دوێنێ (١٣٧١/٨/٢٢) نامەی ١٣٧١/٨/٣ ئەو خۆشەویستە گەیشتە دەستم . لە هەواڵپرسی تان سپاس دەکەم، ماڵ و منداڵ و دەروجیران هەموو دۆعات دەگەێینن و زۆر مەممنوونن .

سەبارەت بە ماڵەکەت نووسیبووت ، بە حەمدی خودا هیچ شتێکی خراپ ڕوی نەداوە و هەموو شتێک لەسەر جێگەی خۆیەتی، دڵنیابە کە بە ئومێدی خودا هیچ شتیک ناقەوێ و کارەکانت بە ئارخایەنی جێ بەجێ بکە، جا وەرەوە بۆ ئێرە. بۆخۆت دەزانی شەوانەش گەڕەکی ئێمە کێشکچی هەیە و تا ڕۆژ هەر دەگرێ و ئاگای لە ماڵەکانە.

فەرموبووت کە ئەم زەحمەتەی ئێمە قەرەبوو دەکەیتەوە ، دەبێ عەرزت بکەم کە جیران بەرانبەر بەجیران ئەرکی لەسەر شانە وئێمە وەزیفەی خۆمانمان ئەنجام داوە ، هیچ نیازی بە قەرەبوو کردنەوەنیە ـ هەر سڵامەتی تۆمان دەوێ .

برای ئێوە ـ هەڵکەوت بانەیی

## ١٧ ـ نامەی دەستگیران بۆ دستگیران

بە ناوی خودای بێ هاوتا

١٣٧١/٨/١٠

دەستگیرانی خۆشەویستم نەشمیل خانم

خۆشەویستم سڵاوتان لێ دەکەم. بە هیوام کە ئەو عازیزەم هەمیشە ساغ و سڵامەت بێ وگوڵی باغی ژیانم هەرگیز بە تەوژمی شەختەی ڕۆژگار نەژاکێ.

عازیزەکەم: لەو ڕۆژەوە کە دیاری کرای بۆ من و مەلا مارەی کردی، ڕۆژ بە قامک دەبژێرم کە کەی زەماوەند بکەین. من هەر ئەو ڕۆژەی کە مارەم کردی و بووی بە حەڵالم دە-مویست بتگویزمەوە. بەڵام، بابت فەرمووی کە ئەو ساڵ سەبر بکەین هەتا دیپلۆمەکەت وەر دەگری. منیش بە پیچەوانەی ویستی خۆم، بە فەرمایشی باوکی بەڕێزت ڕەفتارم کرد.

بەهیوام کە بە زوویی دیپلۆمەکە وەرگری و ژیانی هاوبەشمان دەستی پێ بکا. وا بزانم گیرو گرفتیەک کە بابت بووی، ئەوە بوو کە جیازیت بۆ سازکات. خۆشەویستە-کەم: ئێمە لاوین و دنیا بە ئاسۆیەکی ڕووناکترەوە دەبینین. جا هەر لەبەر ئەمە، دەمەوێ بە بابت عەرز بکەی ئێمە نیازمان بە جیازی نیە ـ ئەمە یاسای کۆنە پەرستانە ـ جیازی مانای چیە؟ من ناهێڵم کەوچکێک لەگەڵ خۆتدا بهێنی.

من بۆ خۆم هێندێک کەل و پەلم ئامادە کردووەوکاتێک دەرسەکەت تەواو بوو دەتگوێزمەوە بۆ ماڵی بابم وهەر لەوێ لەگەڵ دایکم و بابم دەژین. ئاخر دایک وباب منداڵیان

بۆ پیری دەوێ ، ئیدی پێویستی چیە بچین لەماڵێکی دیکە بژین . براکانی تۆش هەر دەبێ وا بکەن ، کاتێک ژنیان هێنا بچن لەگەڵ دایک وبابت بەیەکەوە بژین .

ئیدی بەخودات دەسپێرم .

هەڵوێست کرمانج

## ١٨ ـ وەڵامی نامەی دەستگیران بۆ دەستگیران

بەناوی خودای زانا وتوانـــا

١٣٧١/٨/٢٥

بۆهەڵوێست کرمانج ـ دەستگیرانی خۆشەویستم

نامەکەتگەیی نامەسەرچاوم بەناوت قەسم بۆ تونەماوم

هەڵوێستگیان ! نامەی ڕێکەوتی ١٣٧١/٨/٢٥ی ئەو خۆشەویستەم لە کاتێکدا پێ گەیی ، کە شەوو ڕۆژ لە خەیاڵت داـبووم. بە قەولی شاعیر دەڵێ: " شەوان پەژارە و ڕۆژان ڕۆـڕۆمە ، پاکی دڵتەنگی دووریەکەی تۆمە".

گیانەکەم ! لەو ڕۆژەوە کە منیان لەتۆ مارە کردوە ، وا دەزانم کە تازە لە دایک بووم. ئێستاش شەو و ڕۆژخەریکی دەرس خوێندنم،تا هاوین دیپلۆمەکەم وەرگرم و زەماوەن بکەین.

سەبارەت بەجیازی نووسیبووتان، زۆر سپاستان دەکەم . دیارە بۆ خۆت دەزانی کە بابم کارگەری دارتاشخانەیە ( نەـجاریە ) و کرینی جیازی بۆ ئەو زۆر موشکوڵە .

ئەوەکە گوتبوت لەگەڵ باوکت ودایکت بەیەکـــەوە بژین ، زۆر کارێکی باشە ، هەم کرێ خانوو نادەین وهـــەم دایک و بابت کەپیر بوون،پەرەستاریان لێ دەکەین . ئـــەی ئەولاد بەکاری پیری نەیە فایدەی چیە ؟.خۆ من کچەکەی کوێخـا نەعمان نیم ، گوتی ئیلا و بیلا دەبێ مێردەکەم خانوی جیـــاوازم بۆبگـــرێ .

بەهیوای هاتنی هاوین وزەماوەنەکەمان ،خودا حافیزیـــت لێ دەکەم.

نەشمیل بەردەزەردی

## ١٩ ـ نامەی هاوڵی کوڕ بۆ هاوڵی کوڕ

بەناوی یەزدانی گەورە

١٣٧١/٨/١٣

هاوڵی خۆشەویستم کاک فەرهاد کامەم

کاکی خۆم سڵاو ، چۆنی فەرهادگیان ؟. بەهیوام کار و بارت چاک بێ و سڵامەت بی . لە من بپرسی ساغ وبێوەیم.

کاک فەرهاد! هەروەک دەزانی بەینێکە خەریکی فێر- بوونی زمانی کوردیم و لە ڕووی کتێب ، گۆوار وڕۆژنامە - کانەوە هەوڵی فێر بوونی نووسین و خوێندنەوەی کوردی دەدەم. چەند ڕۆژ لەمەو پێش کتێبێکم گیر کەوت بەناوی "نامە نووسینن بە کوردی" ، کە زۆرم کەڵک لێ وەرگرت . ئەلعان ئەم نامەیە بۆ تۆ دەنووسم ، نازانم هیچ تۆفیرت بە کوردیەکەم کردوە ؟. ئایا ئێستا باشتر دەنووسم ؟. بەڕاستی هەر کەسێک کە زمانی خۆی نەزانێ وەک کەڵەشێرێک وایە کە نەزانێ بقووقێنێ ـ عەجایەب نیە ؟.

پێم خۆشە ئەمجارە هەرچی نامەت بۆ نووسیم ، بە زمانی کوردی بینووسی ، منیش هەر وەڵامت بە کوردی بۆ دەنووسمەوە .

پرسیارێکشم هەیە ، تۆ کە کوردی باشتر دەزانی . بەبیرو ڕای تۆ ، چاکترین کتێبی هۆنراوەی کوردی کامەیە؟. تا بیکڕم .

برای تو هێمن کانیە ڕەشی

## ٢٠ – وەڵامی نامەی هاوالّی کوڕ بۆ هاوالّی کوڕ

بە ناوی خودای توانا و گەورە

١٧١/٨/٢٠

هاوالّی خۆشەویستم کاک هێمن کانیە ڕەشی

سلاو . نامەی ١٣٧١/٨/١٣ م پێ گەیی. زۆر خۆشحالّ بووم. هەوالّی منت پرسیبوو، بە مەرحەمەتی تۆ چاکم – پەژارەم تەنیا دووری تۆیە.

کاک هێمن ! ئافەرین بۆ کوردیەک کە نووسیبووت ، بەڕاستی زۆر جوان بوو. هیچ ئیرادی نەبوو. بە هیوام کە هەر درێژە بە کوردی خوێندن بدەی و ڕۆژ بەڕۆژ پسپۆڕتر بی.

پرسیبووت " کامە کتێبی شێعرباشە؟ ". لە وەڵامدا دەبێ عەرزتان بکەم کە هۆنراوە وەک چێشت وایە . کەسێک شایەد چێشتێکی پێ خۆش نەبێ ، بەلام کەسێکی دیکە هەر ئەو چێشتەی زۆر پێ خۆش بێ . من بۆ خۆم هۆنراوەی ئەم شاعیرە کوردانەم زۆر پێ چاکە :

١ – نالی
٢ – وەفایی
٣ – ئەحمەد موختارجاف
٤ – گۆران
٥ – قانیع

بەتەمای نامەکانی دیکەی ئێوەم

فەرهاد کامەم

## ٢١- نامەی قوتابی کوڕ بۆ قوتابی کوڕ

بە ناوی خودای بێ وێنە

١٣٧١/٨/١

برای خۆشەویستم کاک ئەهوەن بێسارانی

پاش سڵاو و چاک وخۆشی ، لە دوورەوە ماچت دەکەم. بەهیوام کە لە دەرس و خوێندن دا سەر کەوتوو بی .

کاک ئەهوەن ! منیش تازە چوومەتە پۆلی سێ هەم و خەریکی دەرس خوێندنم ، ماموٚستاکانمان هەر یەکی خەڵکی شارێکن . بۆ وێنە یەکێکیان خەڵکی کامیارانە ، یەکێک خەڵکی تیکانتەپەی هەوشارە ، یەکێک خەڵکی بیجارە و دەتوانم بڵێم هەر کامیان لە شارێکەوە هاتوون.

وانە (دەرس)ەکانمان زور سەختن ، چون هەوەڵی ساڵە هێشتا بە تەواوی ڕانەهاتووین . جا نازانم ئێوە لە دەرسەکانتان دا چۆنن ؟.

خەریکی خوێندنی زمانی کوردیش هەر هەم و لە ڕووی ئەم نامەیەوە، دەزانی کە تا چ ڕادەیەک چوومەتە پێشەوە . ئەگەر کتێبی ڕێزمانی کوردی باشتان هەیە، چەن دانەم بۆ بنێرە یان بۆم بکرە، پارەکەیت بۆ دەنێرم .

هەر بژی بە ساغی و سەرکەوتوویی .

سامان کامیارانی

## ٢٢ - وەڵامی قوتابی کوڕ بۆ قوتابی کوڕ

بە ناوی یەزدانی بەتەنێ

١٣٧١/٨/١٤

برای دەلالم کاک سامان کامیارانی

سڵاو. نامەجوانەکەی ڕیکەوتی ١٣٧١/٨/١ گەیشتە دەستم. بەڕاستی بە کوردیەکی جوان نووسیبووت، ئافەرین بـــرا، یا خودا هەر خۆش بی، نازانم چۆن کوردی نوسین وا زۆر زوو فێر بووی ؟ . کاش منیش وەک تۆ فێر بوایەم.

کاکی خۆم! سەبارەت بە دەرس و مەشق نووسیبوو- تان، دەرس خوێندن هەمیشە ئەرکێکی گەورەیە وعیسان دەبێ زەحمەتی لەگەڵ دا بکێشێ. شاعیر دەفەرموێ "گەنج بەبـــێ ڕەنج بە دەست نایەت". منیش بە هیوام کە تۆ کە ڕەنـــج دەکێشی، ڕۆژێک گەنجی زانست بە دەست بهێنی .

سەبارەت بە کتێبی ڕێزمان نووسیبووتان، لـــە زۆر کتێبفرۆشیم پرسیارکرد، دوو دانەم بۆت پەیدا کرد، ئـــەوە لەگەڵ ئەم نامەیەدا بۆتی دەنێرم . بە داخەوە خۆم هیچم نەبوو، لەبەر ئەوە مەجبوور بووم بۆت بکڕم.

دەرسەکانی ئێمەش هەر زۆر گرانە . من نـازانـــم کەسێک کە دەبێ بۆ نموونە لە پاشان دیپلۆمی تەجـربەبـی وەرگرێ، بۆچی دەبێ هێندەش تاریخ وجوغرافیای پێ بلێن؟. مەشهورە دەڵێن "هەموو کەس هەموو شت دەزانن، نـــەک کەسێک .

براکەم ئیدی بە خودای گەورەت دەسپێرم.

ئەهوەن بێسارانی

## ٢٣ ـ نامەی کچ بۆ باب

بە ناوی خودای گەورەوبێ هاوتا

١٣٧١/٨/٤

بابی خۆشەویستم وجێگەی شانازیم

بابەگیان سڵاو! سڵاوێک بەگەرمی هەستی محەبەتی بەتینی تۆ سەبارەت بە ئێمە، سڵاوێک بە پان و بەرینی هەستی باوکانەی تۆ و هەست و ئەوینی دایکانەی دایکم. هەم دەستی تۆ وهەم دەستی دایکم ماچ دەکەم و دۆعای هەتاو و هەڵمەتیش دەگەیێنم.

بابەگیان! ماوەی ساڵێک دەبێ کە شووم کردووە، زۆر سپاستان دەکەم بۆ ئەو هەموو زەحمەتەی کە تۆو دایکم کێشاتان، قەت لە بیرم ناچێتەوە. گلەی قەبریش لە بیرمی نابا تەوە.

باوکی خۆشەویستم! منیش وەزعم زۆر باشە.بەختیاری مێردم زۆر پیاوێکی چاکە و هیچ موشکلێکمان نیە، فەقەت دووری ئێوە نەبێ. جا کە وایە،تکا دەکەم ئەم پایزە لەگەڵ دایکم بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک سەرێکمان بدەن،تا چاومان بە دیدارتان ڕوون ببێتەوە. بەختیاریش دەستان ماچ دەکا و دۆعای هەموو لایەک دەگەیێنێ.

هەوای ئێرەش زۆر ساردە، هەر کاتێک هاتن دەبێ جلی گەرم بکەنە بەرتان، چون ئێمە دەمێکە کوورەمان داناوە و ـ ئەلعان لە دوندی کێوەکان بەفر باریوە.

بەهیوای دیتنی ئێوەم کچی تۆ ـ شلێرمیراودەلی

## ٢٤ – وەڵامی نامەی باب بۆ کچ

بەناوی یەزدانی بێ هاوتا

١٣٧١/٨/١٥

کچی بەڕێزم ، نووری چاوانم شلێرخانم

دوای سڵاو، هەم من وهەم دایکت وهەتاوی خوشکت و هەڵمەتی برات ماچت دەکەین و بە هیوای ساغی، سڵامەتی و بەختە وەری تۆین . ئێمەش هەموومان ساغین ، دایکت هەر خەریکی کەیبانوگەریە، منیش هەر لە قوتابخانە دەرس دەڵێم و هەتاو و هەڵمەتیش دەرس دەخوێنن .

لەوەی کە ئێمەت دەعوەت کردبوو، زۆر سپاست دەکەین . دیارە خۆت دەزانی کە ئەلعان وەختی دەرس وکارە ، ئەگەر مەرەخەسیان پێ دام – دوو سێ ڕۆژ لەگەڵ دایکت دێین بۆلات . ئەگەر نەیاندا ، دەبێ هەڵی گرین بۆ هاوین ، کە قوتابخانە تەعتیلە و دەتوانین منداڵەکانیش لەگەڵ خۆماندا بهێنین .

ئێمە هەمیشە ئاواتمان بەختەوەری ئێوەیە وهەموو- شمان لە هەستی گەرمی کاک بەختیاری مێردت سپاس دەکەین ودۆعای دەگەیینین.

دیسانەوە بە خودای مێری مەزنت دەسپێرم

باوکت

## ٢٥ - نامەی وەرزشکار بۆ وەرزشکار

بەناوی خودای توانا وزانا

١٣٧١/٨/٥

برای خۆشەویستم، وەرزشکاری سەرکەوتوو کاک ڕاپەڕ

لەکانی لەوە سڵاوتان لێ دەکەم. هیوام وایە کە لەش و ڕۆحت ساغ بن وهەمیشە لە کاری وەرزش دا سەرکەوتوو بی. لە منیش بپرسی سڵامەتم.

براکەم! بیستوومە کە چەند ڕۆژ لەمەوپێش لە کێ - بەرکێی (موسابەقەی) تۆپی پێی (فوتباڵ) ی ئاسیادا، پلەی دووهەم دەرهاتووی، کە بەم بۆنەیەوە پیرۆزباییتان لێ دەکەم و وەرگرتنی میداڵی زێوین بە ئێوە تەبریک عەرز دەکەم.

منیش بڕیار وایە لە کێ بەرکێی تۆپی قەرتاڵە (باسکێتباڵ)ی سەر تا سەری ئێران دا، بەشداری بکەم، کە لە مانگی داهاتوودا، لە شاری ساری پێک دی. نازانم لە ڕۆژنامەی وەرزشی دا، خوێندووتەتەوە یا خەیر، لە لایەن لیوای کوردستانەوە، من و حەمەی ناسر و ڕازان قشڵاقی بەشداری دەکەین - جا ئیدی نازانم چۆن دەردەچین ؟.

لەگەڵ ئەمنامەیەشدا، چەند دانە وێنەت بۆ دەنێرم، کە لە کێ بەرکێی ساڵی ڕابوردوی کوالالامپووردا، خستبوومان.

بەهیوای سەرکەوتی زۆرتری ئێوە.

بڕیار لاجانی

## ٢٦- وەڵامی نامەی وەرزشکار بۆ وەرزشکار

بە ناوی خودای توانا و دڵۆڤان

١٣٧١/٨/١١

هاواڵی دڵۆڤان کاک ڕاپەڕ

سڵاوتان پێشکەش دەکەم ، لە هەستی بەتینی ئێوە سپاس دەکەم، بە هیوام ساغ و بەختیار بن و هیچ کۆسپێک لە ژیانتان دا نەبێ .

کاک ڕاپەڕ ! زۆر سپاس لە نامەی ١٣٧١/٨/٥ ، کە پیرۆزباییتان تێ دا نووسیبوو. بە هیوام کە من میداڵی زێوم وەرگرتوە، تۆ میداڵی زێڕ وەرگری، چون حەقی خۆتە .

هەواڵم بوو کە قەرار وایە لە شاری ساری کێبەرکێی سەراسەری تۆپی قەرتاڵە بەڕێون بچێ، بەلام نەم دەزانی لە چ روژێک دایە. ئێستا کە ڕۆژەکەیم بۆ ڕوونە ، حەتمەن دێم بۆ تەماشاکردن ، جا کە وایە ئەگەر دەکرێ ، دوو دانەبلیتم بۆ بنێرە.

لە قەولی منەوە دۆعای کاک ڕازان قشلاغی وکاک حەمەی ناسر بگەیێنە. بۆ ئەوانیش داوای سەرکەوتن دەکەم.

منیش چەند دانە وێنەی کێ بەرکێی شاری کوالالامپوور تان، لەگەڵ ئەم نامەیە دا ، بۆ دەنێرم.

برات - بڕیار لاجانی

## ٢٧ - نامەی خوشک بۆ برا

بەناوی خودا ١٣٧١/٨/٣

برای بەڕێزم ، چاوی چاوانم کاکە ڕێبوار

سڵاوی خوشکی دڵسۆزی خۆت قەبوول بکە. بەهیوام هەر وا کامەڕان و ساغ و بێ وەی بی . نامەی ١٣٧٠/٨/٣یشم زیارەت کردوە.

برای خۆشەویستم !. دەمێ بوو کە دەمویست نامەت بۆ بنووسم ، بەڵام ناونیشانە تازەکەم نەبوو، دوێنێ ناو نیشانەکەتم لە دایکم سەند.

لە ئێمە بپرسی هەموو ساغین . دڵداری مێردم هەر لە دووکان ئیش دەکا ، خەزێمی کچم دیپلۆمی وەر گرتوەوئەگەر بۆی بکرێ، هەوڵ دەدا ، کە ئەمساڵ بچێتە زانستگە لقی کشتوکاڵ . کاوەش کە لە پۆلی سێهەمی قوتابخانەی ناوەندی دەرس دەخوێنێ و دەرسەکانیشی باشە. خۆشم هەر لە قوتابخانەی سەرەتایی دەرس دەڵێم .

لە قەولی منە ە دۆعای براژنم بگەێینەو چای کەژاڵ و ئازادیش ماچ کەو هەواڵی هەموویان بپرسە ، منداڵەکان و باوکیشیان دۆعای هەموو لایەکتان دەگەێینن .

ئیتر هەر بژی بە سڵامەتی - خوشکی ئێوە ئەسرین

## ٢٨ – وەڵامی نامەی برا بۆ خوشک

بە ناوی خودای میهرەبان

١٣٧١/٨/١٨

خوشکی خۆشەویستم ، خوشکە ئەسرین – شنۆ

لەگەڵ سڵاو، پێتان ڕادەگەیێنم کە نامەی ڕێکەوتی ١٣٧١/٨/٣ م پێ گەیی و لە بان چاوم دانا . بە هیوام کە خۆت ، کاک دلداری مێردت ، خەزیمی کچت و کاوەی کوڕت ساغ و سلامەت بن . کورتێی ژنم ، کەژاڵی کچم و ئازای کوڕم هەموویان دۆعای گشت لایەکتان دەگەیێنن.

ئێمەش لە ورمێ کار وبارمان چاکە . هەروەک دەزانی، من لە یانەی جەنگەڵداری کار دەکەم. جەیرانی خێزانیشم لە یانەی ئامارە و منداڵەکانیش هەروەک جاران دەرس دە – خوێنن . باوەڕ بکە، زۆر کاتە دەڵێم بچین بۆ شنو سەرێکیان بدەین ، بەڵام کاری ئیدارە و دەرسی منداڵ و کوێرەوەری ، دەرفەت نادەن . ئیشەڵڵا هەڵی دەگرم بۆ ئاخری بەهاری ساڵی داهاتوو، بەشکوو پێمان کرا و هاتین .

خوشکە ئەسرین ! . ئەگەر دەکرێ ،ناونیشانی تازەی بژۆڵی خوشکمانم، بۆ بنێرە ، چون دەمەوێ نامەیەکیش بۆ ئەوبنووسم .

برای ئێوە – ڕێبوار

## ٢٩ - دەعوەتنامەی برا بۆ برا

بەناوی خودای بێ هاوتا

١٣٧١/٨/٥

برای چاک و دڵسۆزم کاک دڵپاک

سڵاوی خۆم وتەواوی بنەماڵەی خۆم پێشکەش بەتۆ، برای عازیز وخۆشەویستم . کاک دڵپاک ! . هەروەک دەزانی ١٥ ڕۆژی دیکە، واتە لە ١٣٧١/٨/٢٠ دا ، قەرا وایە کە شەرمینی کچم بگوێزنەوە بۆ لاوێنی کوڕی حاجی غەفوور.

هەر بەم بۆنەیەوە لێتان دەگێڕمەوە ( دەعوەتتان دەکەم ) ، کە بێن بو سەر زەماوەن و براژن و تەواوی مندالەکان و پوورویشم لەگەڵ خۆتدا بهێنی .

چون کارمان زۆرە، ئەگەر دەکرێ سێ ڕۆژ بەر لە ڕۆژی زەماوەن ، تەشریف بهێنن وبرێک نوێن وپێخەف لە تەک خۆتاندا بهێنن ، چون میوان زۆرە و نوێن و پێخەف کەمە .

بەهیوای ئەوەی کە هەرچی زووتر بتان بینم.

براتان - کاکە مەم

## ٣٠ – وەڵامی دەعوەتنامەی برا بۆ برا

بەناوی یەزدانی دڵۆڤان

١٣٧١/٨/١٠

برای زۆر خۆشەویستم کاکە مەم

لەگەڵ ڕێزو سڵاو، نامەی ١٣٧١/٨/٥ گەیشت . زۆر – سپاس لەوەی کە بۆ شایی شەرمین بانگت کردووین . هەم خۆم، هەم براژنت، هەم منداڵەکان دۆعات دەگەیێنین و دۆعای براژنیش دەگەیێنین و چاوی منداڵەکان ماچ دەکەین.

بەسەر ئەو چاوانەم، سێ ڕۆژ لە پێش‌دا، واتە، لە ڕۆژی ١٣٧١/٨/١٧ دا دێین و نوێن و پێخەفیش دەهێنین . ئەگەر حاجەت و حوجەتیشتان دەوێ، بە تێلیفۆن پێم بڵێن، تا بۆتان بهێنم. قەرار وایە بە ماشینی خۆمان بێین ، لەبەر ئەمە، هیچ موشکوڵ بۆهێنانی شتەکان نیە .

بە ئاواتی بەختەوەری شەرمین وسڵامەتی هەمووتان.

براتان – دڵپاک

سگزی
زابولی
خەری
هیروی
پەهلەوی
پەشتو
فارسی تازە
دانارکی
نۆرویژی
لیتوانی
سویدی
چێک
پرۆمانی
پورتەگالی
بولغاری
مەجاری
ئیسپانیایی
ئیتالیایی
یۆنانی
لاتین
فارسی قەدیم
گیلی
لەکی
کەلهوڕی
ڕووسی
پالی
هەورامی
لوڕی
ئاسامی
مەهاراتی
سۆرانی *
ئەلمانی
گەجەراتی
کرمانجی
ئینگلیسی
سینهالی
زازا
بەنگالی
ئوروپایی
فەڕانسە
کوردی تازە
لولۆ
ئوردو
هیندی = سانسکریت
مادی = ئەوێستایی
ئاریایی
شەجەرەی زمانی کوردی
ئینسانی

## بەشی ٤ کورتە باسێک سەبارەت بە زمانی کوردی

هەروەک لە شەجەرەی زمانی کوردی بۆمان دەر ـ دەکەوێ ، زمانی کوردی یەکێکە لە زمانەکانی هیندو ئورووپایی . دیارە ڕیشەی تەواوی زمانەکانی جیهان زمانی ئینسانیە ، واتە قسە کردن بە هۆی زمان ( زمانی نێودەم).

لەپاشان کە چەشنە کۆمەڵگەلێکی ئینسانی دروست بوون، زمانی ئاریایی بە گوێرەی لقێک لە زمانەکان ناسرا ، کە ئەویش لە زمانی ئینسانی جوێ بووەوە و ڕەگاژ ـ وی کرد .

لەزمانی ئاریایی چوار زمانی سەرەکی جوێ بونەوە ، کە ئەمانە بوون:

١ ـ زمانی مادی
٢ ـ زمانی پارسی قەدیم
٣ ـ زمانی هیندی
٤ ـ زمانی ئورووپایی

ئ ـ زمانی مادی بریەتی بوو لە کوردی تازە ، کە ئەویش ئەم زاراوانەی بوو:

١ ـ لۆلۆ
٢ ـ زازا
٣ ـ کرمانجی ( بادینی)
٤ ـ سۆرانی ( زمانی ستانداری کوردی)
٥ ـ لوڕی

٦ ـ کەلوڕی
٧ ـ گیلی
٨ ـ لەکی
٩ ـ هەورامی

ب ـ لەزمانی پارسی قەدیم ، ئەم زمانانە جوێ بوونەوە:

١ ـ فارسی تازە
٢ ـ پەهلەوی
٣ ـ دەری
٤ ـ زابلی (زابولی)
٥ ـ سگزی
٦ ـ سغدی
٧ ـ هێرەوی
٨ ـ پەشتو.

ج ـ لە زمانی هیندی ئەم زمانانە جوێ بوونەوە:

١ ـ پالی
٢ ـ ئاسامی
٣ ـ مەهاڕاتی
٤ ـ کەجەڕاتی
٥ ـ سینغالی
٦ ـ ئۆردو

(کە ئەو شەش زمانەی سەرەوە، لە زمانی بەنگالی جوێ بوونەتەوە). یانی بەنگالیش خوێ لقێک لە زمانی هیندی ـ بوو.

د ـ لە زمانی ئورووپایی، ئەم زمانانە و چەند زمانی دیکەش جوێ بوونەوە:

١ ـ فەڕانسە
٢ ـ ئینگلیسی
٣ ـ ئەلمانی
٤ ـ ڕووسی
٥ ـ لاتین
٦ ـ ئیتالیایی
٧ ـ ئیسپانیایی
٨ ـ پورتەقاڵی
٩ ـ فلامیش
١٠ ـ چەک
١١ ـ سوێدی
١٢ ـ نۆڕوێژی
١٣ ـ دانمارکی
١٤ ـ لێهستانی
١٥ ـ ڕۆمانی
١٦ ـ بولْغاری
١٧ ـ مەجاڕی
١٨ ـ یۆنانی
١٩ ـ چەند وردە زمانی دیکەش.

ئێستا بۆ ئیسباتی ئەم مەبەستە، کە ئەم زمانانە هەموویان لە زمانێکەوە جوێ بوونەتەوە، واتە لە زمانی (ئاریایی)، وشەی (نا) لە نەزەر دەگرین، کە بزانین

بەو زمانانە چی پێ دەڵێن :

١- کوردی : نا
٢ - فارسی: نە
٣ - ئەلمانی : ناین
٤ - ئینگلیسی : نەو
٥ - فەڕانسە : نێ
٦ - ڕووسی : نێت
٧ - ئیتالیایی : نۆن
٨ - ئۆردو : نە
٩ - دەری : نە
١٠- پەهلەوی: نە
١١- هیندی : نەهی

جا لە سەرەوە بۆمان دەرکەوت کە چەندێک لەیەک نزیکن ، چون هەوەڵ پیتی هامویان هەر پیتی " نە"و ئەمە بۆخۆی بەڵگەی نزیکی هەرە زۆری ئەم زمانانەیە لەیەک، بۆیەک بەم زمانانە وبەم گەلانە دەڵێن هیندو ئوڕوپایی .

خوێندەواری خۆشەویست! بە هیوای ئەوەی کە ئەم کتێبە جێگەی کەڵک و سوودبێ، تکام وایە هەر تیبنی یەکتان سەبارەت بەم کتێبە هەیە، بە ناونیشانی تهران - صندوق پستی ١٥٨٧٥/١١٣٧ - حسن صلاح (سۆران) ، بۆ منی بەڕێ بکەن تا کەڵک لە بیرو ڕای ئێوەی خۆشەویست وەرگرم.

تاران - ١٣٧١ هەتاوی
حسن صلاح ( سۆران)

باوەكوو مانای بڕێك لە وشە گرانەكانم لە دەقی كتێبەكەدا ، لە نێو پارانتێزدا ، نووسیووە ، ئێستا لێرەدا ، فەرهەنگۆكی وشەكانتان پێشكەش دەكەم :

ئارخایەن = دڵنیا
ئاسۆ = ئوفوق
بەشداری = شیركەت
بایەخ = ئەرزش
باكالۆریا = لیسانس
بەیەكجاری = بۆهەمیشە
بەسەر خۆمیەوەناهێڵم = قەرەبوی دكەمەوە
بێ وەی = بێ مەلال
پەژارە = غەم
پیت = حەرف
پیت = بەرەكەت
پسپۆڕ = شارەزا
پۆل = كلاس
تێز = پایان نامە
تایبەتمەندی = خوسیات
تۆپی پێ = فوتباڵ
تۆپی قەرتالە = باسكێتباڵ
جیازی = جەهیزیە
جل = لیباس
جگە = غەیری

چاوەڕوانی = ئینتیزار
حاجەت و حوجەت = زەرف و زروف
خوێندكار = دانشجو
خەرمانان = شەهریوەر
خۆزگە = بریا
دەرس وێژ = مودەڕڕیس
دڵۆپە = چككە
دەستگیران = نامزەد
دڵۆڤان = میهرەبان
ڕەگازۆ = ڕیشە هاویشتن
ڕاهاتن = داهاتن
زانستگە = دانشگاە
زەماوەن = شایی
سەرەكی = ئەساسی
سێمینار = جەلەسەی عیلمی
سەمپۆزیوم = كوبوونەوەیحرفەیی
سەردار = سەردار عەزیزخان
شەختە = سەرمای سەخت
قەی ناكا = ئیشكالی نیە
كەلەوا = خانوی كۆن یا ڕووخاو
كان = تەرك = مەعدەن

کەڵەشێر = کەڵەباب = خوروس

کێ بەرکێ = موسابەقە

کۆسپ = گرفتاری

گلێنکە = مەردومەک

گوێزانەوە = عەروسی کردن

لیوا = ئوستان

لێ گێڕانەوە = دەعوەت

لەش = بەدەن

م . س = فەوقی لیسانس

مووچە = حوقوق

مەڵبەند = مەنتەقە

میری مەزن = قادری موتەعال

نەکەرۆز = کێویکە لای سەقز

نوێن = لێفەوبان

ناونیشان = ئادرێس

ناخ = تەرک . بێخ

وچان = تەعتیل

هاوژین = هاوسەر

یانە = ئیدارە

## ناوەرۆک

ئەم کتێبانەی نووسەر بەم زوانە دەردەچن :

١ ـ کتێبی " هەڵبژاردە" (کۆمەڵەشێعرێک) ،بەکوردی
٢ ـ جەلدی ٢ ی کتێبخانەی سۆران ( بیبلیۆگرافی کوردی) ، بە کوردی .
٣ ـ یاسای هەتاو ، کە ڕۆمانێکی کوردیە
٤ ـ ناوی کوردی ، بریەتیە لە ناوگەلی کوڕ وکچ بە کوردی.